پەیامی ژمارە -٦-

یان

# بزووتنەوەی ئیسلام

لەدووڕیانی (مان) و (نەمان) دا

علی باپیر

تێبینیی زۆر گرنگ :

لەبەرگرتنەوەی (اِستنساخ) ی ئەم پەیامە بە هەموو جۆرێك قەدەغەیە

بێ بە هیچ کەس بدرێ لەدەرەوەی ڕێکخستن مەگەر لەخۆت زیاتر

انەی پێ بکەیت ..

بسم الله الرحمن الرحيم

الحمد لله والصلاة والسلام علي رسول الله محمد وآلهِ ومن والاه ..

براو خوشکه بەڕێزەکانی ڕێکخستن : السلام عليكم ورحمه الله وبركاته ..
ئەمجارەش کە دەمەوێ لە دوو توێی پەیامی ژمارە (٦) راستەوخۆ لەگەڵتان بدوێم چەند بابەتێکی گرنگم بۆ هەڵبژاردوون کە بە کورتی عەرزتان بکەمو شەرحو تەفسیر و لێکدانەوەشیان عایدی خۆتان دەکەم .

یەکەم : بارودۆخی ئێستای دونیا ...

پێش ڕوخانی بلۆکی ڕۆژهەڵاتی کوێخایەتیو حوکمرانێتی دونیا دوو جەمسەری هەبوون بەلام ئێستا ڕۆژئاوا - ئەمریکاو ئەوروپا - کوێخایەتی دونیای بۆ یەکلابوەتە -وەو ئاشکراشە کە ڕوژئاوا میراتگری ڕۆمو ئیغریقەو لە ڕوانگەی فەلسەفەیەکی ماددی و تاک پەرستیەوە تەماشای ژیان دەکات ، بۆیە ئێستا لە ژێر سایەو ڕکێفی کو-ێخایەتی ڕوژئاوا سەرلەبەری دونیا کاڵای ماددیەتو دنیا پەرستی بە باڵا براوەو مرۆڤایەتی چارو ناچار بەرەو زەلکاوی ماددە پەرستیو ئاژەڵێتی پەلکێش دەکرێ دونیاش بەو پانو پۆریەی بۆتە مەیدانی غارغارێنو تەراتینی زلهێزەکانو خێروبێری نازو نیعمەتەکانی سەرزەویش زۆربەی خەڵکی سەر زەوی لێیان بێ بەشەو لە خز-مەت ژمارەیەکی کەمو مشەخۆرو بەزەبرو زۆردانە..

دووەم : جیهانی ئیسلامی ..

مەبەستمان لە جیهانی ئیسلام هەموو ئەو سەر زەمینانەن کە ڕۆژێک لە ڕۆژان حوکم و بەرنامەی ئیسلامی تیادا بەر قەرار بووە ، جا ئەو جیهانە هەر چەندە بەڕوا-ڵەت لە ژێر سێبەری شوومو لەبن ڕکێفی کوێخا ( ڕۆژئاوا )دایە ، بەڵام لە خۆ بەزیاد بێت لە نێو خۆی دا لە جۆشو خرۆشێکی سەرسوورهێنەر دایە . ئەگەر دونیا بە منداڵدان (رحم) و ئیسلام بە کۆرپە (جنين) بچوێنین ، دەتوانین بڵێین : ئێستا عالەمی ئیسلام لە حالەتی گەرمەژان ( مخاض) خۆی دایەو دەیەوێ (ئیسلامی ) ببێ بەلام دەبێ دلنیا بین کە هەروەک چۆن هیچ کۆرپەیەک بەبێ ئێشو ژانو ئاسۆرو نارەحەتیو خوێن لە ڕەحەمی دایکی نایەتە دەر ، ئیسلامیش بەبێ خەباتو خەمو خەفەتو خوێنو نەخەوتنو خۆبەختکردنو هەستانەوەو هاتنەوە کایەی مەحالە جا ئەوەش کە مایەی دڵخۆشیو هیوایە ئەوەیە کە موسڵمانان لە هەموو گۆشەو کەنارەکانی دنیای ئیسلام چاکیان بە لادا کردووەو چەکیان بە دەستەوە گرتووەو ڕێبازی ( احدى الحسنيين ) ی قورئانیان گرتووەو بەرەو لوتکەی چەسپاندنی حوکمی خوا هەنگاو دەنێن .
ئەوەتا هەرکام لە جەزائیرو میسرو بۆسنەو هەرسکو چیچانو کشمیرو کوردستان ... بوونەتە گۆڕەپانی لە گۆڕنانی ناحەزانی ئیسلامو دوژمنانی چاکیو پاکی دادگەری.

ـێیەم : عیراق

ڕژێمی دیکتاتوری بەعسی خۆسەپێن بەسەر عیراقدا هەرچەندە زۆر لاواز بووە
والەت وا دێتە بەر چاو کە کوێخا ڕوژئاوا خۆشی نەوێ‌و بە مانەوەی ڕازی
ێ بەڵام لە سۆنگەی ئەوەوە کە زل هێزەکان‌و دنیا خۆرەکان ئەوەی‌بیری لێ
وە بەرژەوەندی خەڵک‌و جەماوەرەو هەتا ئێستاش نەیانتوانیوە نۆکەرێکی
و خۆ یان ناڕاستەوخۆی چاکترو دڵسۆزتر لە صەددام‌و ڕژێمەکەی بدۆزنەوە
ێ هەر دەمێنێ‌و دەستی پێوە دەگرن ، مەگەر ئیرادەی جەماوەری موسڵمانی
ق یەکدەست بکەوێتە کارو ڕابەڕێ‌و نەخشەو موعادەلاتی سیاسەتی نوێی جیها-
ی بە درۆ بخاتەوە کە بێگومان ئەمەش شتێکی ئاسایی‌و گونجاوەو مەحاڵ نی‌یە

وارەم: کوردستان

ە مەبەستمان لە کوردستان ئەم بەشەیە کە لکێنراوە بە دەوڵەتی عیراقەوەو
دۆخی ئەو بەشە کوردستانەش ئاوا دەبینین :
حەتمەن خوێنەرانی بەڕێز لە یادیانە کە کاتی خۆی پێش هەڵبژاردن‌و دامە-
ی ( پەرلەمان ) بەندە لە کتێبی ( چارەسەری کێشەی کورد لە نێوان ئیمان‌و
ەماندا ) پێش بینی ئەوەم کردبوو کە مادام لە دروست کردن‌و بونیات نانی
ەمان‌و کیانی سیاسی کورددا ئیمان‌و بیرو باوەڕی کورد ڕەچاو نەکرێ‌و ،
ەنجامی پەرلەمان‌و حکومەتیش لە سەرەنجامی ( بەرەی کوردستانی ) باشتر
ـێ .
هەروەها ڕەنگە لە یادیان بێ کاتێک کە ئێمەی بزووتنەوەی ئیسلامی لە کەشو-
ایەکی هێمنانەدا ویستمان مانۆر ( استعراض ) ێکی ئیستعراضیکی عەسکەری لە
ە بکەین‌و دەستەیەک لە ( ینک ) بوونە پەرچ‌و من بۆ دڵدانەوەی برایان وتار-
خوێندەوە و تیایدا گوتم ( حوکمەتی هەرێم کەوتۆتە لەقە لەق‌و هەندێک کە-
نەوی بەسەر ئێمەی ساغ بکەنەوە ..... ) بەڵێ لەو کاتەدا هەر کام لە پارتی‌و
یەتی قەڵس بوون کە بۆچی فلانە کەس وای گوتووە ؟؟ بەڵام من پێم گوتن : کە
ە ڕەنگی خەتەرەو وەرنەوە سەرحاڵ ئەگەرنا بە لەقەلەقەوە ناوەستێ‌و دەکەو
ە تەقەتەقیش ، چونکە ( تاریکە ئەو سەر لە ئیوارە دیارە ) .
بەڵێ ئێمەی ئیسلامی کە لە ڕوانگەی قورئانەوە دەڕوانین‌و بەتەرازووی
ع شتان هەڵدەسەنگێنین ئەم وەزع‌و بارودۆخە تەنگ‌و تاڵەی ئێستا کوردستانما-
لە لا شتێکی چاوەڕوان کراو بوو پێشبینیشمان کردبوو پێشیناتیش لە مێژە
ووبانە ( کوزە چی تێدا بێ هەر ئەوەی لێ دەڕژێ ) .
تایانی باسە ئێمە وەک ئیسلامیانی کوردستان ئەم بارە کرژ‌و ناهەموارو ماڵ
ترانکەرەی کوردستانمان بەکجار بێ ناخۆشەو پێمان وایە کە ئێمە لە هەموو
ی زیا تر زیانمان لێ دەکەوێ چونکە لە هەموو کەس خۆمان بە ڕاسترو دڵسۆز
دەزانین بۆ گەلەکەمان کاری ئێمەش کە خزمەت کردنە بە خەڵک ج لەبواری
ەوی‌و فەرهەنگی‌و ج لە بواری ماددی‌و گوزەرانەوە پێویستی بە حاڵەتی هێمنی
ایش هەیەو ڕاوچی خراپیش لە ئاوی شلوێ دانەبێ ڕاوی بۆ ناکرێ .

بێگومان ئەم شەڕەی ئێستاش کە سێیەمین شەڕە لە دوای ڕاپەڕین (انتفاضە)ی ١٩٩١ ـ ەوە کە یەکیەتی هەر جارە بە سەر لایەک دا سەپاندویەتی ڕەگو ڕیشەکەی بە قوڵایی مێژوودا شۆڕ بوتەوە بۆ ساڵانی شەستەکان هەر چەندە دام و دەزگای ڕاگەیاندنی ـ یەک ـ کە هۆکاری تازەو ئێستایی بۆ بدۆزێتەوە .
وە بە بۆچوونی ئێمە ئەم شەڕە ئەگەر ئەم جارەش وەک جاری پێشوو لە نیوەی ڕێگادا بوەستێ‌و بە هەر هۆیەک بێ پەنچەر بکرێ ، جارێکی ترو جارێکی تر هەرسەر هەڵدەداتەوە هەتا یەکێک لەو دوو حاڵەتە پەیدا دەبێ:(١) .

آ ـ یان یەکێک لە پارتی‌و یەکیەتی تەسلیم دەبێ‌و مل کەچی ئەوی تر دەبێ و دان دێنی بە براگەورایەتی دا ، کە ئێستا یەکیەتی زیاتر ئەوەی لێ چاوەڕوان دەکرێ .

ب ـ یان طرفێکی تر دەبێتە ( بدیل ) ی جێداری هەردووکیان لە کوردستاندا ، کە بەس ئیسلامیەکانیش ئەوەیان لێ چاوەڕوان دەکرێ بەڵام جاری ساوا‌و بزووتنەوەی ئیسلامیش کە براگەورەو پێشرەوی ئیسلامیەکانی کوردستانە لەسەر ئاستی سەرکردایەتی هەندێک دەردو گیروگرفتی لە مێژینەی هەن ئەگەر چارەسەر نەکرێن پێم وانیە بتوانێ هیچی وا گەورە بکات ، پێشینانیش گوتوویانە ( کاریتە لە کڕی هەڵناکەوێ ) .

سێهەم : هەڵسەنگاندنێکی حاڵەتی ئیسلامی لە کوردستاندا ..

حاڵەتی ئیسلامی لە کوردستاندا لە چەند تەوژم‌و (تەیار ) ێک پێکهاتوە کە ئەمانەن :

١ ـ بزووتنەوەی ئیسلامی :
کە تەوژمێکی فیکری پەروەردەیی سیاسی چەکداریە
هەرچەندە ئەو ماڵەی کە هەتا ئێستاش بە ڕواڵەت سەرکردایەتی بزووتنەوە دەکەن‌و بە موڵکی خۆیانی دەزانن زیاتر بزووتنەوەیان وەک دیاردەیەکی سیاسی چەکدار ناساندوەو خستۆتە ڕوو بەڵام هەقیقەتو نێوەڕۆکی بزووتنەوە لە لای زۆربەی هەرە زۆری ئەندامانی سەرکردایەتی ( هیچ بە دەست )و هەموو ئەندام‌و پێشمەرگەکانی ئەوەیە کە گوتم . دیارە بزووتنەوەش تا ئێستا توانیویەتی لە چەند لایەنێکەوە ڕۆڵێکی گرنگ لە کوردستاندا بگێڕێ ، بەڵام ئەوەی کە بۆتە بەرجی بەردەمی و نەیهێشتووە وەک پێویست دەوری خۆی ببینێ و ئەو بۆشاییە فیکری و قەیرانە سیاسیەی کە لە کوردستاندا هەیە پڕ بکاتەوەو ئومێدو هیوای زیاتر بخاتە دڵی خەڵکی بێ هیواو نیمچە بێ هیوا بریتیە لە نەبوونی سەرکردایەتیەکی ڕاستو واقیعی ، وە لە ڕاستی دا بزووتنەوەی ئیسلامی زۆر جار لە نێو تۆفانی شەپۆلاوی کارەساتو ڕووداوەکاندا وەک کەشتیەکی بێ کەشتی یەوان دێتە بەر چاوان کە کەمتر وایە بە

(٦)

ویستی خۆی بە ڕێوە بچێو زیاتر شەپۆلی ڕووداوەکان ناوی دەدەن بەملاولادا .

۲ ـ برایانی موسلمان ( الاخوان المسلمون ) :

کە ئێستا لە ژێر ناونیشانی ( یەکگرتووی ئیسلامی )دا کاردەکەن ئەمیش تەوژمێکی فیکریو پەروەردەییو ئیسلامییە بە پێی بۆچوونی قوتابخانەی ( برایان ) کە لە ساڵی ( ۱۹۲۸ ) لە سەر دەستی بەڕێز مامۆستا حسن البنــــا لە میسر سەری هەڵدا . بێگومان ئەم کۆمەڵە تا ڕادەیەک دەورو خزمەتیان هەیەو جێی ڕێزو تەقدیرن بەڵام بەوشێوازەی کەلەسەری دەڕۆن کە هەڵقوڵاوی کاتو شوێنێکی دیکەی زۆر جیاواز لەکوردستانە ناتوانن دەورو کار ـ یگەر یەکی ئەوتۆیان لەسەر کۆمەڵگای کوردەواریدا هەبێت . ئەمەو سەرەرای ئەوەی کە تەوژمی ناوبراو هەرچەندە نیو سەدە زیاترە کارو خەباتیان هەیە بەڵام لە هیچ وڵاتێک بۆیان نەلواوە کە کۆمەڵگاو قەوارەیەکی سیاسی ئیسلامی پێک بهێنن کەواتە پێویستە لەسەر تیشکی قورئانو سوننەتو لەبەر ڕۆشنایی ڕاستییەکان واقیعی ئەمڕۆمان دا چاو بە نەخشەو بەرنامەی کاریاندا بگێڕنەوە .

۳ ـ سەلەفییەکان :

ئەمانیش کە زیاتر توێژێکی گەنج و ساوان تەوژمێکی فیکرین کە زیاتر لە ڕووی عەقیدەو بیروباوەڕەوە کاردەکەنو بە بڕوای خۆشیان کۆمەڵگای کوردەواری لە شتی نەفسانەو داهێنراو و بیدعەت بزار دەکەن جا هەرچەندە هەبونی تەوژمێکی ئاوا پێویستــــە هەروەک چۆن هەبوونی کومەڵێکی پسپۆر لە شەرع ( متخصص فی الفقه ) دا . وە کۆمەڵێکی پسپۆرو کا رامە لە تەزکیەو ئەخلاقدا پێویستە ، بەڵام زۆر پێویستە کە حیکمەتو لێزانی و کارامەیی لە لایەکەوەو هاوسە ـ نگی ( توازن ) لە لایەکی ترەوە ڕەچاو بکرێن ، کە ئێمە نیبینی زۆرمان لەو ـ بارەوە لەسەر ئەو کۆمەڵە هەیە کە تەوژمی ناوبراو لە کوردستاندا پێک دەهێنن شایانی باسە کە مەبەست لە حیکمەتو لێزانی زۆر شت دەگەیەنێو سادەترینــی ئەوەیە کە ( أولویاتی ) ئیسلام لەبەر چاو بگیرێنو سوننەتو ئادابەکانی پێش ـ روکنو فەرزەکان نەخرێن .. وە مەبەست لە ( هاوسەنگی ) یش زۆر شتەو لە پێش هەموو شتێکیشدا ئەوەیە کە ئیسلام وەک خواو پێغەمبەر فەرموویانە بخرێتە بەر چاو نەک وەک تێگەیشتن (فهم) ی زانایەک یا چەند زانایەک دیارە لە حالەتێکی واشدا دووچاری ئەو هەڵە زەقانە نابین کە بڵێین ئیسلام بەس عەقیدەیە ، یان بەس تەزکییەیە ، یان ...یان.....

۴ ـ ئەهلــی طەریقــەت :

... ئەمانیش کەلە نێو خۆیاندا دوو بەشی سەرەکین . نەقشیو قادری یەکەمیان خۆیان بە پێرەوی ( بەهاءالدین نەقشبەندی ) دەزانن دووەمیشیان بە پەیڕەوی ( عبدالقادری ) گەیلانی . کە هەردووکیان دوو زانای پایە بەرزو خواپەرستی ناوازە بوون ، بەڵێ ئەهلی طەریقەت بە هەردوو بە شەکانییەوە تەوژمێکی مەعنەوییو تەعبیر لە لایەنێکی گرنگی ئیسلام دەداتەوە ، بەڵام ئەو تەوژمە لە واقیعی ئەمرۆدا تا ڕادەیەکی زۆر ڕەسەنایەتی خۆی لەدەست داوە و شتی نەفسانەییو داهێنراوی زۆری ڕەگەل خراوەو سەرباری هەموو ئەمانیش گەلێک جار پەیڕەوانی طەریقەت مەسلەکی خۆیان کە وەک گوتم بەشێکو لایەنێکە لە ئیسلام ناسێنێکی سەربەخۆو ڕەفتاری خۆشیان بە سوڵتانەتییەکی تێرو تەراو و بێ لەکــە

لە قەڵەم دەدەن .

کەواتە: دەبێ ئەهلی طەریقەت دوو کاری گرنگ ئەنجام بدەن ئەگەر بیانەوێ زیانیان لە قازانجیان پتر نەبێت ، یەکەم : مەسلەک و ریبازەکەیان لە هەرچی ئەفسانەو بیدعەتو دژی شەرعە پاک بکەنەوەو لە مەحەکی قورئان و سوننەتی بدەن دووەم : بزانن کە ئەوەی ئەوان پێی هەڵدەستن لە زیکرو فیکرو ئادابی طەریقەت بەشێکو لایەنێکی دینە نەک سەرتاپای دین ..

بەڵێ ئەمانە تەوژمە سەرەکیەکانی ئیسلامیین لە کوردستاندا ، هەڵبەتە چەند کومەڵێکی تریش هەن کە کەمو زور دەورو کاریگەری خۆیان هەیە وەک ;

( بزووتنەوەی ڕاپەڕینی ئیسلامی ) ( حرکــــه النهضه الاسلامیه ) کە بە تایبە ت لە بواری فیکری‌و روشنبیریدا دەوریان هەیە وە ( حزب الله ی شورشگیری کورد ) کە لە بواری چەکداریدا پەرێزیان لە هەندێک ناوچەدا دیارە ، بەلام چونکە هیچ کامیان نەبوونەتە تەوژمیکی سەربەخۆ بۆیـــە نەمکردنە خاڵێ تایبەت ، شایانی باسیشە کە هەردووکیشیان لە رووی فیکری جیهاد-یەوە لە بزووتنەوە زور نزیکن‌و ماوەیەک پێش ئێستا پرۆژەی دروستکردنی بەرەیەکی ئیسلامیشیان خستە روو ، بەلام هەندێک کەس پەرچیان تێ خستو سەری نەگــرت ، ئەوەندە هەیە لە لای ئێمە ئەو قەزیە هەر لە پێشەو هەرکاتێک دەستمان بڕوات ئاوی لێ ئاخوێنەوەو بەرەی ئیسلامی لە کوردستاندا بنیات دەنێین

حەوتەم : بزووتنەوەی ئیسلامی لە دووریانی راست بوونەوەو پوکانەوەدا ..

دیارە هەبوونی کەمو کورتی‌و ناتەواوی لە خودی ئینسانو هەر جموجوڵو چالاکیەک داکە ئەنجامی دەدات ج بە شێوەی تاکو ج بە شیوەی کومەل شتیکی ئاسا-یی‌و سروشتیە ، بەلام ئەوە کە ئینسان یان کومەڵ لەگەل کومەڵە دەردو نەخۆشیەکدا دەستەو یەخە بێت کە فرزەی لێ ببڕێو خەریک بێ لەبنی بێنێ شتێکی ترە جا بزووتنەوەی ئیسلامی لە مێژە بەدەست ئەو ماڵەوە کە خۆیان کردۆتە جیسەو بە دەستو کەشتیەوانی ، گرفتار بووەو دووچاری چەندان هەڵەو هەڵدێری بێجو برو فەوتێنەریان کردوەو هەر لوتفو بەزەیی‌خوا دەفریای هاتوەو قوتاری کردوە زەقترین نەخۆشی‌و دەردیش کە بزووتنەوەی ئیسلامی بەدەست ئەو بنەماڵەوە گرفتاری بووە ئەوەیە کە ڕاوێژ ( شوری ) ی تێدا یەک خراوەو هیچ ئیش‌و کارێک مەگەر بە دەگمەن دەنا بە پێی داموو دەزگا ( الموسسة ) بە ڕێوە ناچێ ، وە لـــە ڕاستیدا هیچ کەس هەر لە مەکتەبی سیاسیەوە بگرە هەتا خواری لە ئاست ئەو ماڵەدا هیچ بەدەست نیەو ئەوان بوونەتە تاقە سوارەو هەمە کارەی بزووتنەوە جا ئەوەی کە دەردەکەی سەختترو قورەکەی خەست تر کردووە ئەوەیە کەماڵــی کورێنیش لە نێو خۆیاندا ناکۆکن‌و لەسەر " سوکان " بە دەست بوونو هەموو شت بوون کوریس بچرکێنەیانە هەرچەندە جاروبار بە ڕواڵەت وا پیشان دەدەن یان فشارو ترس ناچاریان دەکات وا بنوێنن کە پێکەوە ئاشتو تەباو رێکن‌و لە بەرا-مبەر سەرجەم بزووتنەوەدا یەکیان گرتووەوسوویان بە بەینەوە ناچێ وەک لـــە کوبوونەوەی ئەمجارەی بزووتنەوەدا بینرا کەلە هەڵەبجە سازکراو ناونرابـــوو

زنی تایبەت )
بۆیە بە دڵنیاییو قەناعەتێکی تەواوەوە دەڵێم : بزووتنەوەی ئیسلامی لەو
ەدا کەوتۆتە سەر دووریانی مانو نەمان کە (مان) پەیوەستە بە راستـــــەوە
وەیو هاتنەوە سەر جادەی شەرعو وەگەڕ خرانەوەی را وبۆچوون و ڕێزگرتن لــــە
راو بۆچوونی ئەندامان و تاریێ سپێردان بە پێی توانا و لێ هاتووی و بەر-
چوون بە گوێرەی نەخشەو بەرنامەیەکی ڕوون لە ڕێی چەند داموو دەزگایە
سیاسیو عەسکەریو دارایی ...هتد ، یان(نەمان ) و فەوتانی مۆکەریو
وەی بەهۆی بەردەوام بوونی لەسەر ئەم حاڵو وەزعەی کە تێی کەوتووەو
ەلاو نەخۆشییەی کە یەخە ی گرتووە و پەکی خستووە .
ناقە ڕێگایەکیش کە پێویستە بۆ چارەسەری حاڵی شپرزەی بزووتنەوە بگرێتە
ەوەیە کە سەرجەم شوور خۆڕو دڵسۆزە ماندوو ڕەنج دەرەکانی بزووتنەوە
ە ئەندامانی مەکتەبی سیاسیو سەرکردایەتییەوە بگرە هەتا سەرجەم ئەندا-
ی ڕێکخستنو هێزی پێشمەرگەش دڵو دەنگ و دەستو هەڵوێستیان بکەنە یەک و
یری بکەن لەسەر گۆڕانکاریو هێنانەوە سەر خەتو گێڕانەوە سەر شەرعی قیادەی
بزووتنەوە و سنووردانان بۆ ئەو حاڵەو بە کورتیو بە کوردی :
اردنو چەسپاندنی ( قیادەیەکی شەرعی ) کە هەڵقوڵاوی شوراو ئیرادەو ویستی
خۆڕو دڵسۆزانی بارلەسەر شانی بزووتنەوەی ئیسلامی بێ ..
ەنوە وەک جەرگ سووتاوو دەردەدارێکی لە مێژینەی نێو بزووتنەوەو ( ناصح
) ێکی ئایینو خەڵکی خوا دەڵێم : ئەمان سەد ئامان با وریا بین کەسانێک
سەر بەرژەوەندی شەخسیو ماددی خۆیان یان لەسەر مەرامو مەبەستێکی
یو غەیرە شەرعی خۆیان لەگەڵ ئەو حاڵە دانیشنو سەنگەری لێ گرتوون بەڵام
کاولترو بێ حاڵترنو لە خەسڵەتە خراپو ناشەرعیەکانی ئەواندا بەشدارنو
ازیشیان بە سەریان دا هەیە ، با نەیەڵین خۆیان بخزێنە ڕیزەکانمانەوەو
انی لووسیو وتاری بێ کردار خۆیان نەکەنە ماسۆتکو دەمڕاستی قەزیەکەمان
:
: ئێمە خەڵک لەسەر بوغزوو غەرەزوو دوژمنکاری کۆناکەینەوە بەڵکو
. خۆشەویستیو برایەتیو قەناعەت ...
: نامانەوێ واقیعمان وابێکـــە پەندی ( قەل بە قەل دەڵێ ڕووت ڕەش بێ )
سەردا بچەسپێ ..
: خەسڵەتی خراپو بێ شەرعی لە هەر کەسێکدا هەبێ هەر وەک یەکەو نابێ
تیفەو سۆز بەسەر عەقڵمانەدا زاڵ بێ ...
: بۆ هێنانەدی ئامانج (هدف)ەکانـــــی شەرعی نابێ پەنا بەرینە بەر وەسیلەی
، وەلە ڕاستی دا ئەگەر لەگەڵ ئامانجە شەرعییەکانماندا ڕاست بکەین ڕێگامان
ەنایان بۆ بەرینە بەر وەسیلە ناشەرعییەکان ..
: با کاری خۆمان لەسەر بناغەیەکی قوڵو پتەو بنیات بنێینو کەسانێکی ساغ
لە کلک دەرهاتوو متمانە پێ کراو لە تاقی کردنەوە دەرچوو بۆ ئەو کارە شەرعییە
رنگە هەڵبژێرین ، چونکە ئەوە کاری دونیاو قیامەتەو بەر پرسیارێتی لای خواو
ە دواوەیە ( ولا حول ولا اقوة الا بالله العليِ العظيم ) ..

هەشتەم : ئەركی سەر شانمان لەم قۆناغەدا

آ ـ لە چوغزی بزووتنەوەدا :

ئەركی سەر شانمان لەم قۆناغە سەختو دژوارەدا كە بزووتنەوەی ئیسلامی پێدا تێپەر دەبێ بریتیە لە تێ گەیاندنو رونكردنەوەی چاكترو زیاتری ئەندامو پێشمەرگەو دۆستو لایەنگرانی بزووتنەوە سەبارەت بەو واقیعە تالو حالە بێحالەی كە تێی دابینو زەمەنسازیو رێخۆشكردن بۆ ئەو گۆڕانكاریە پێویستو شەرعیەی كە پێشتر باسمان كردوو بۆ ئەوەی وەك خوای كاربەجێ فەرموویەتی : ( لیهلك من هلك علی بینة ویحی من حی علی بینه ) الانفال هەڵبەتە لێرەدا مەبەستم ئەوە نیە كە دەركای غەیبەتو زەم و زەمكاری بخرێتە سەر پشت ، بەڵكو زیاتر مەبەستم ئەوەیە كە ئەرخەڵكە لە بنەماو بنچینە شەرعیەكانی پەیوەست بە حوكمی ئیسلامیو بەرێوەچوونی كۆمەڵو بزووتنەوە ئیسلامیەكان حالی بكرێ .وەك مەسەلەی شوراو سنووری گوێ رایەڵیو بە قسەكردن ( السمع والطاعه ) بۆ فەرماندە .. مەرجەكانی فەرمانده ( الأمیر ) و ، پێویستیو ئەركەكانی سەر شانیو هەق و مافەكانی بەسەر شوێنكەوتوانیەوەو هەقو مافەكانی ئەوانو ..... هتد ، پاشان بەراورد كردنی حالی ئەو حالەی كە ئێستا قیادەی فیعلی بزووتنەوەیان بە چنگەوە گرتووە لە هەموو بوارەكانی سیاسیو عەسكەریو داراییو دەرەوەو راگەیاندنو ..... هتدەوە لەگەل بنەما شەرعیەكاندا ، كە بێگومان ئەوكاتە راستیەكان وەك رۆژی روون ئاشكرا دەبن . دیارە كە دەشڵێین ئەوە ئەركی سەر شانمانە لەو قۆناغەدا مەبەست ئەمە نیە كە بەس خەریكی ئەمە بین بەڵكو ئەم كارەش یەكێكە لە كارو ئەركە شەرعیەكانی ئەم قۆناغەن .

ب ـ لە دەرەوەی بازنەی بزووتنەوەدا :

لەكەس پەنهان نیە كە لایەنە سیاسیە لائیكەكانی كوردستان بە گشتیو یەكیەتی بە تایبەتی لە ئەنجامی شەری كورد كوژیو سەرنەكەوتنیان لە بەرێوە بردنی حكومەتی هەرێمو چارەسەر كردنی كێشە و قەیرانە سیاسیو ئابووری و كومەلایەتیەكانی خەڵكی كوردستاندا لەبەر چاوی زۆربەی زۆری خەڵكی كورد بێزراونو خەڵك ئومێدێكی وای پێیان نەماوەو لێیان دڵسارد بووە ، وە بە پێچەوانەشەوە جەماوەری كوردستان ئومێدو هیوایەكی زۆری بە ئیسلام پەیدا بووەو دڵی زۆر بە ئیسلامیەكان خۆشە جا لێرەدا زەمینەیەكی یەكجار لەبار رەخساوەو دەرفەتێكی باش هەڵكەوتوە بۆ ئیمەی ئیسلامی بەگشتیو بەتایبەت بزووتنەوەی ئیسلامی كە پێشرەوو برا گەورەو سەروسێبەری حالەتو تەوژمە ئیسلامیەكانی كوردستانە ، كە زیاترو چاكتر خەڵكی كورد لە ئیسلام تێ بگەیەنینو بە تایبەتی وەچەی نوێیان لە قوتابخانەی قورئاندا پێ بگەیەنن ، وە لە كێشەی نیوان لایەنەكانیشدا پارەنگێكی قورس بن بۆ سەقامگیر كردنی ئاشتیو تەباییو پێشگیری كردن لە كوێخایەتی و خۆ رانانو زەبروزۆرو دەستدرێژی كردنە سەر یەكتریان .

نۆیەم : رەمەزان مانگی بە خوداچوونەوەو پاك بوونەوەو لەخوانزیك بوونەوەیە ،

بەڵی خوشکو برا سەنگینەکانم ، ئەوا مانگی ڕەمەزان مانگی نورو هیدایەت مانگی خێرو بدرەکەت ، مانگی زیکرو فیکر مانگی تەقواو صەفا ، ئەمساڵیش هاتو بووبە میوانمان ، ئیدی بە ئومیدی ئەوە کە ئەم مانگە موبارەکەی ئەم ساڵ خوای ذوا - الجلال بیکاتە مایەی بەرەکەتو پیزی زیاتر لە تەمەنی پێنجو دوو ڕۆژەی ژیانی دونیامانڎا ، بەشکم ئەم مانگە پیرۆزە بەهۆی بەخۆدا چوونەوە پاک بوونەوەو لەخوا نزیک بوونەوەمانەوەش ببێتە سەرەتای ڕاست بونەوەوە چاکبونەوە و ساغ بوونەوەی بزووتنەوەی ئیسلامیو قوتاربوونی لەو دەردو نەخۆشی ڕکوشندانەی کە گیرۆدەیان بوە

— خوایە بۆ خاتری ناوە چاکو جوانەکانتو سیفەتە بەرزو پڕ سندەکانت هەموو لایەکمان هیدایەت بدەیو سەرکەوتوو بکەی کە بەهۆی عیبادەتی بێ خڵتەوزیکری بە فیکرو تەقوای بە ( فحوی ) و قورئان خوێندنو پاڕانەوەو خێرو خێراتو چاکەکاریو فیداکاریو ...هتد ەوە لەم مانگی ڕەمەزانەدا تۆ لە خۆمان ڕازی بکەینو خۆمان لە هەڵەو تاوانو سەرپێچییەکانو چلکرچەپەریشیان ڕزگار بکەین هەتا وامان لێ دێ شایستەی هەموو لوتفو کەرەمو بەخششێکی تۆ دەبینو لە خەمی دونیاو قیامەت دەرەخێێن . آمین .

عەلی باپیر
هاوینە هەواری صلاح‌الدین
١٩٩٥/١/١٠

(١) دیارە فەرز نییە تەنیا بە یەکێک لەم دوو حاڵەتە شەڕ کۆتایی پێ بێت ، بەڵام هەلکەوتو چۆنیەتی ئێستای ئەو دوو لایەنە،هەر ئەو دوو حاڵەتە هەڵدەگرێ .

## چەند ئاگاداریەکی گرنگ

===================

یەکەم :
ئێمە بە هیچ شێوەیەک ڕازی نین بەوەی کە بزووتنەوە ببێتە دوو بەش یا چەند بەشێک، وە لەڕاستی دا سەبرگرتن و دان بەخۆداگرتنی حەوت هەشت ساڵەما هەر لەبەر خاتری پاراستنی یەکبوونی بزووتنەوە و هێنانەوە سەر خەتی یەک سانتیمەتر لەو ئامانجە شەرعیە پاشەکشە ناکەین .

دووەم:
کەواتە ئێمە ئەو داوایەی خۆمان بە هەقو ڕاست دەزانین بۆیە دەڵێین دەبێ هەموو ئەندامانی وردودرشتی بزووتنەوەی لەسەر کۆ ببنەوە یەکدەنگ بێ ، بەلام ئەگەر هەموویان زۆربە ڕاو هەلوێستێکی دیکەیان هەبوو ، بۆ وێنە گوتیان جاری وایە یان ( اهون الشرين ) ئەوەیە کە دەسکاری سەرکردایەتی ئێستای بزووتنەوە نەکرێ ئەوە ئێمە ناچارین قسەی خۆمان بکێشینەوەو بێ دەنگ بین هەر چەندە قەناعەت و بۆچونیشمان هەر وەک خۆی بێتو گۆرانی بەسەردا نەیەتو بێگومان ناشیەت..

سێیەم :
هەرچەندە ئێمە دەلێین : هەتا ئەو مالە کە جلەو بە دەستو هەمە کارەی بزووتنەوەن چ بە ئیختیاری خۆیان چ بە ناچاری لەو حالەتەی ئێستایان نەگۆرێن و لە شوێنی ئێستایان لا نەدرێن مەحالە بزووتنەوە سەرکردایەتیەکی شەرعی بۆ پەیدا بێت چونکە ئەو مالە نەمانی خۆیان لەوەدا دەبێنن کەلەسەر بنچینەی شورا وهەلبژاردنو ئیرادەی ئازادی مشورخۆرو دلسوزان ( اهل الحل والعقد )ی بزوو ـ تنەوە سەرکردایەتی دیاری بکرێ ، بەلام بە ڕەواو ڕاستیشی نازانین کە بە ـــ شێوەیەکی عاتیفیانە وبێ ویژدانانە زەربیان بەسەردا بهێنرێو بگوترێ بە کەلکی هیچ نایەن ، با ئەوانیش وا بە خەلکی تر بگرە بەهەموو ( اهل الحل والعقد )ی بزووتنەوە بلێن لە کاتێکدا لە بەرامبەریان دا دەوەستن ، چونکە وەلامی بێ شەرعی بە بێ شەرعی ڕاست نیەو شوێن کەوتنی هەواو ئارەزوویە .

چوارەم :
بەندە لەو هەولی گۆرانکاریو ڕاستکردنەوەی قیادەی بزووتنەوەدا ئیددیعای هیچ ئیمتیازێکی نەکردووەو ناکاتو ڕازیش نیە هیچ کەس هیچ شۆرەتو ناوێکی بۆ بەکار بهێنی هەتا قسەو هەلوێستی سەرجەم مشوورخۆرو دلسۆزانی وردو درشتی بزووتنەوە دەبێتە یەک ، جا ئەو کاتە ئەوان بڕیاریان بەدەستە لە سنووری شەرعدا .

والله يتولى الصالحين

